زنجیرە ڕێنماییەکانی دێرین ژمارە ٨٤ ژمارەی مۆڵەت ١

## کۆمەڵێك ئادابی شەرعی

## ئادابی حەوتەم

# ئادابەکانی ڕۆژی هەینی




نوسین و ئامادەکردنی
م. هەڵگۆرد مصطفی گەلاڵەیی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على نبينا محمد وآله وصحبه وسلم.

## ئادابەكانی رۆژی هەینی

١) خۆ شۆردن: هەندێك لە زانایان فەرموویانە خۆ شوشتن لە رۆژی هەینی دا واجبە بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی: ﴿غسل يوم الجمعة واجب على كل محتلم﴾ صحيح البخاري: ٨٧٩.

واتە: خۆ شوشتن لە رۆژی هەینی دا واجبە لەسەر هەموو كەسێكی باڵغ.

٢) خۆ بۆن خۆشكردن و قژ چەور كردن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿لا يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ، وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ ، وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ ، أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ ، ثُمَّ يَخْرُجُ ، فَلا يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ ، ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الإِمَامُ ، إِلا غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ ، وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى﴾.

واتە: هیچ پیاوێك نییە لە رۆژی هەینی دا خۆی بشۆرێت، وە خۆی پاك و خاوێن بكاتەوە هەندەی كە بتوانێ تلە خۆ پاك و خاوێن كردنەوە، وە لەو رۆنەی كە هەیەتی بدات لە خۆی، وە لە بۆنی ماڵەوەی خۆی بۆن خۆش بكات، ئینجا لە ماڵ دەربچێت و نێوان دوو كەس حیا نەكاتەوە، ئینجا هەندەی كە بۆی نووسرابێت نوێژ بكات، ئینجا كاتێك وتار بێژ قسە دەكات بێ دەنگ بێت ئیللا خوای گەورە لە تاوانی نێوان ئەم هەینیەو هەینیەكەی تری خۆش دەبێت.

٣) سیواك كردن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿غسل يوم الجمعة على كل محتلم وسواك ويمس من الطيب ما قدر عليه﴾.

واتە: خۆ شۆردن لە رۆژی هەینی دا لەسەر هەموو باڵغێكە، وە سیواك كردن و خۆ بۆن خۆشكردن لەو بۆنەی هەیەتی.

٤) لەبەر كردنی جوانترین پۆشاك: پێغەمبەری خوا ﷺ هانی موسڵمانانی داوە كە لە رۆژی هەینی دا جوانترین پۆشاكیان لەبەر بكەن.

٥ ) زوو ڕۆیشتن بەرەو مزگەوت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکی صەحیحدا فەرموویەتی: ئەوەی زوو لە ساتەوەختی یەکەمی ڕۆژی هەینی دا بچێت بۆ مزگەوت وەکو ئەوە وایە وشتری کردبێتە خێر، وە ئەوەی لە ساتەوەختی دووەمدا بچێت بۆ مزگەوت وەکو ئەوە وایە مانگایەکی کردبێت بە خێر، وە ئەوەی لە ساتەوەختی سێیەمدا بچێت بۆ مزگەوت وەکو ئەوە وایە بەرانێکی کردبێت بەخێر، وە ئەوەی لە ساتەوەختی چوارەمدا بچێت بۆ مزگەوت وەکو ئەوە وایە مریشکێکی کردبێت بە خێر، وە ئەوەی لە ساتەوەختی پێنجەمدا بچێت بۆ مزگەوت وەکو ئەوە وایە هێلکەیەکی کردبێت بەخێر، پاشان ئەگەر ئیمام چووە سەر میمبەر فریشتەکان گوێ لە زیکر و وتار دەگرن و چیتر پاداشتی زوو هاتن بەرەو مزگەوت نانوسن.

- بۆیە زوو هاتن بەرەو مزگەوت پاداشتێکی تایبەتی هەیە ئەوەی لە دوای ئیمامەوە بێت ئەو پاداشتەی لە دەست دەچێت، بەڵام پاداشتی ووتار و نوێژەکەی بۆ دەبێت تەنها پاداشتی زوو هاتنی لە دەست دەچێت.

٦ ) زۆر سەڵەوات دان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿أَكْثِرُوا عَلَيِّ مِنَ الصَّلاةِ فِي كُلِّ يَوْمِ جُمُعَةٍ " فَإِنِّ صَلاةَ أُمَّتِي تُعْرَضُ عَلَيِّ فِي كُلِّ يَوْمِ جُمُعَةٍ ، فَمَنْ كَانَ أَكْثَرَهُمْ عَلَيِّ صَلاةً كَانَ أَقْرَبَهُمْ مِنِّي مَنْزِلَةً﴾.

واتە: لە ڕۆژی هەینی دا زۆر سەڵەواتم لەسەر بدەن، چونکە سەڵەواتی ئوممەتەکەم لە گشت ڕۆژێکی هەینی دا پێم دەگات، جا هەر کەسێك زۆر سەڵەواتم لەسەر بدات ئەو کەسە پلەی نزیکترە لێمەوە لە ڕۆژی قیامەتدا.

٧ ) خوێندنی سورەتی (الكهف): پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿من قرأ سورة الكهف في يوم الجمعه أضاء له من النور ما بين الجمعتين﴾.

واتە: هەرکەسێك لە ڕۆژی هەینی دا (سورەتی الكهف) بخوێنێت ئەوە نێوان ئەم هەینیە و هەینی داهاتووی بۆ ڕووناك دەکاتەوە.

٨ ) خۆ پاراستن لە هەنگاو نان بەسەر شان و ملی خەڵکدا لەناو مزگەوت لە ڕۆژی هەینی

دا، چونکە ئەو کارە دەبێتە مایەی ئەزیەتدانی موسڵمانان و دروست نیە.

٩) نزیك بوونەوە لە ئیمام: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿احْضُرُوا الذِّكْرَ ، وَادْنُوا مِنَ الْإِمَامِ ، فَإِنَّ الرَّجُلَ لَا يَزَالُ يَتَبَاعَدُ حَتَّى يُؤَخَّرَ فِي الْجَنَّةِ﴾.

واتە: ئامادەی زیکر و ووتار بن و لە ئیمام نزیك بنەوە، بەڕاستی پیاوی وا هەیە بەردەوام خۆی دوور دەخات هەتا لە چوونە بەهەشت دوا دەکەوێت.

١٠)ئەنجام دانی نوێژی سونەت بەبێ دیاریکردنی ڕکەعەتەکانی.

بەڵام تایبەت کردنی دوو ڕکەعەت وەکو ئێستا لە زۆرێك لە مزگەوتەکان ئەنجام دەدرێت کاتێك خەڵکی لە دوای بانگی یەکەمەوە گشتیان بە یەکەوە هەڵدەستن دوو ڕکەعەت دەکەن ئەم کارە بیدعەیەو دروست نیە چونکە هاوەڵان بەم شێوەیە نەیان کردووە.

١١)ئەنجامدانی نوێژی ( تحية المسجد ) لە دوای چوونە ناو مزگەوت پێش دانیشتن، ئەگەر مرۆڤ لەکاتی خوێندنەوەی ووتاریش چووە ناو مزگەوت پێویستە دوو ڕکەعەت موێژی ( تحية المسجد ) بکات ئینجا دابنیشێت.

١٢) قسە نەکردن لەکاتی خوێندنەوەی ووتار: هەر کەسێك لەکاتی ووتاردا قسە بکات گوناهبار دەبێت پاداشتی نوێژی هەینی لە دەست دەچێت.

١٣) دوعا کردن لە کۆتایەمین کاتی دوای عەسر.

١٤)هەڵنەستاندنی هیچ کەسێك لە شوێنی دانیشتنیدا.

١٥) گۆڕینی جێگا لەکاتی خەو هاتن دا.




وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

١٢/ ذو القعدة / ١٤٣٧هـ — ١٥/٨/٢٠١٦م

سۆران

لە بڵاوکراوەکانی پەرتوکخانەی دێرین — سۆران

٠٧٨٢٨٣١٠٥٥٩ – ٠٧٥٠٤١٢٨٢٢٠